زنجیرەی دۆسێیە فەرهەنگی و فیکریەکان

**دۆسێی ژمارە (٥)**

# دۆسێی:

# ئیبن تەیمیە
# سەلەفیەت و تەعریب





نووسینی: محەممەد هەریری

چاپی ئەلکترۆنی یەکەم دیسەمبەری ٢٠١٨

**زنجیرەی دۆسێیە فەرهەنگی و فیکریەکان**

**دۆسێی ژمارە ( 5 )**

## دۆسێی:

# ئیبن تەیمیە

# سەلەفیەت  و تەعریب

**نووسینی : محەمەد هەریری**

**چاپی ئەلکترۆنی یەکەم : دیسەمبەری ٢٠١٨**

# پێشەکی

نەك بە تەنیا سەلەفییەت ئامرازێکی عروبە و تەعریبە، بەلکو کۆی ئیسلام دینێکە خاوەنی تایبەتمەندیەکی عەرەبیە، ئەوەی هاتە ناوەوەی زۆرجاران بیەوێ یان نەیەوێ، بە بێ ئاگاییەوە یان بە ئاگایی خزمەتی تەعریب و عروبە دەکات. بەڵام نکوڵی لێ ناکرێ کە سەلەفییەت لە هەموو ڕێچکە وڕێبازەکانیتری ئیسلام، شوێنکەوتووانی خۆی هاندەدات بۆ تەعریب بوونی خۆبەخشانە و دەیانکاتە ئامرازێك بۆ خزمەتی تەعریب.

کاریگەری سەلەفییەت لەسەر دۆزی تەعریبکردن زۆر بە هێزترە لە کاریگەرییەکانیتر، چونکە کە مرۆڤی سەلەفی دەکرێتە مرۆڤێکی دەقدۆست، تەقدیسی حەدیس ودەق و ڕاوییەکانیش دەکات، ئیتر بەسە کە چەند دەقێکی دینی پیرۆزکراوی نیشان دەیت لە فەزڵ و گەورەیی عەرەب وعروبەت، تا خۆبەخشانە خۆی و تەواوی ئەوانەی لە ژێر دەست و چاودێریدان تەعریبیان بکات!

بۆیە عەرەب بوون و نەبوون هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ. خۆ دەڵێن ئیبن تەیمیە کورد بووە، هەرچەندە من پێموانییە، بەڵام دووریش نییە کوردیش بوو بێت، بەڵام باوەڕناکەم هەتا ئەحمەدی کوری حەنبەلی عەرەبی هێندە دڵسۆز و پەرۆش بوو بێت بۆ تەعریبکردنی هەموو جیهان!

خۆشەویستی عەرەبی و عروبەت هێندە بە دینەوە لکێنراوە و شێلدراوە تا ئەو ڕادەیەی فەیلەسوفێکی فارسی نەژاد و زمان، خەڵکی خوراسانی کۆن و ئۆزبەکستانی ئێستا، کە زانایانی خۆرئاوا ناویان ناوە بە بەتلیمۆسی موسڵمانان، دەوە بورکانێکی سەر مانگیشیان بەناوی کردوە، ویەکەم زانایە لە مێژوو زانی زەوی بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، ئەبو رەیحانی بەیرونی، بەو هەموو عەقڵ وعیلمەوە دەیگوت: (بەخوا پێم خۆشترە بە عەرەبی دامشوڕن وزەمم بکەن نەك بە فارسی مەدح وسەنام بکەن)

"**والله لأنْ أُهْجى بالعربية، أحبُّ إليّ من أن أُمدح بالفارسية!**". **جا تۆ وەرە زانایەكی فەیلەسوفی، فەلەكناسی، دەرمانسازی وا گەورە وابڵێت، ئەی دەبێ ئەو زانایە دینیانە و فەقیهەكان وموحەدیسەكان چی بڵێن؟! چۆن وەكو سەلمان فارسی پێشی لەشكرێك نەكەون بۆ داگیركردن و بە كۆیلەبردنی زن ومنداڵ و پیاوانی میللەتەكەی؟!**

**كێشە هەر لە سەلەفییەت ناوەستێ وەك گووتم، بەڵكو بەسە كە موسڵمانێكی شارەزا بیت ویان زانایەكی ئیسلام بیت با لە میانڕەوترین ڕێچكە و مەزهەبیش بیت، كە خۆبەخشانە بانگەشە بۆ عروبە وتەعریب بكەیت!**

**جەمالەدینی ئەفغانی یان ئەفغانی بوو یانیش ئێرانی فارسی، ڕابەری قوتابخانە ڕیفۆرمخوازی ئیسلامە هەر لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە، پێیوابوو هۆكاری سەرەكی لاوازی وفەشەلی دەوڵەتی عوسمانی لەبەر ئەوە بوو كە تورك ومیللەتانی تری ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی خۆیان تەعریب نەكرد و دەوڵەتیان تەعریب نەكرد!**

**عبدالرحمن الكواكبي كە قوتابیەكی قوتابخانەكەی ئەفغانی بوو، كە دەڵێن كوردیش بوو هەمان ڕای جەمالەدینی ئەفغانی هەیە، و سەركۆنەی توركە عوسمانیەكان دەكات كە وەك ئالی بوەیهییەكان و سەلجوقییەكان و ئەیوبییەكان و چەركسییەكان و ماڵباتی محمد عەلی پاشا خۆیان نەكردە عەرەب و تەعریبی خۆیان نەكرد!**

**ابن بادیس زانای بەناوبانگی جەزائیر كە بەربەریش بوو، لە ڕێگای جەمعیەتی زانایانی موسڵمانی جەزائیر، زۆربەی گەلی جازائیریان تەعریب كرد ودەڵێن: زمانی عەرەبی زمانی دینمانە و زمانی نەتەوەییمانە و زمانی نیشتیمانیمانە، ئەركی ڕەوتەكەمان پاراستنی عروبەت و ئیسلامە، گەڕاندنەوەی جەزائیرە بۆ باوەشی هەردووكیانە ، واتە [عروبەت وئیسلام]**

**خەونی سەلەفیەت و ئیبن تەیمیە و هەموو گەورە ئیمامانی سەلەفیزم تەعریب وكردن وعەرەباندنی هەموو پنتێكی جیهانە كە ئیسلامی پێ بگا. بۆیە ئیبن**

تەیمیە زۆر بە حەسرەتەوە دەڵێت: "لێڕاهاتنی ئاخاوتن بە غەیری زمانی عەرەبی، کە دروشمی ئیسلامە وزمانی قورئانە، تا ئەو کاتەی دەبێتە زمانی ئەو شارە وخەڵکەکەی، وزمانی ئاخاوتنی ماڵەوە ونێوان هاوڕێیان، وزمانی خەڵکی بازاڕەکان، وفەرمانڕەواکان، ودیوانەکان (فەرمانگەکان) وئەهلی فیقە، گومانی تێدا نیە کە مەکروهە وەك باسکرا.

بۆیە موسڵمانەکانی بەرایی، کاتێك لە خاکی شام ومیسر نیشتەجێ بوون، کە خەڵکەکەی ڕۆمی بوون، ولە عێراق وخوراسانیش کە زمانی خەڵکەکەی فارسی بوو، ولە مەغریب کە زمانی خەڵکەکەی بەربەری بوو، خەڵکی ئەو ولاتانەیان لەسەر ئاخاوتنی عەرەبی ڕاهێنا، هەتا عەرەبی زاڵ بوو بەسەر زمانی موسڵمان وکافرەکانیان"

ئیبن تەیمیە پاش زۆر لە خۆکردنێکی زۆر دەڵێت: " جایزە بە زمانی تری –نا عەرەبی- بدوێی، بەلام سەلەف تەنها ڕێگایان پێدا بۆ پێویستی، وپێیان خراپە لە کاتی نا پێویستیدا بۆ پاراستنی شەعیرەکانی ئیسلام، چونکە خوا کتیبەکەی بە عەرەبی دابەزاندوە، بۆ پێغەمبەرە عەرەبەکەی ونەتەوەی عەرەبیشی بە چاکترین نەتەوە دانا، بۆیە پاراستنی ئەو دروشمانەیی عەرەب لە کرۆکی پاراستنی ئیسلام دایە".

ئینجا پاش کاردانەوەی گەلان بۆ ئەو سیاسەتە تەعریبە و ڕەگەزپەرستیەی ئومەویەکان، خەڵکی بەربەرەکانی تەعریبکردنیان کرد، ودەستیان بە زمانی خۆیانەوە گرت، هەرچەندە زۆربەیان ئیسلامیشیان قبوڵ کرد، تا عەرەبە فاتیحە نوێکانیان ناچارکردن بەزمانی ناعەرەبی خۆیان بدوێن لەناو ولاتەکانیان، حاڵەکە بەوە گەیشت کە ابن تیمیە وا باسی دەکات:

(ئینجا خەمساردیان کرد لە بابەتی زمان، وفێری ئاخاوتن بوون بە فارسی، تا زاڵ بوو بەسەریان. زمانی عەرەبی لەلایەن کەسانێکی زۆر وازی لێهێنرا، ئەوەش بێگومان مەکروهە، چونکە ڕێگای ڕاست و چاك ڕاهاتنە لەسەر ئاخاوتن بەعەرەبی،

هەتا منداڵان لە حوجرەکانیش فێری دەبن بۆ نیشاندانی دروشمی ئیسلام وخەڵکەکەی، ئەوەش ئاسانترە بۆ موسڵمانان بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئان وسونەت وقسەی سەلەفی سالح)

سەیر لەوەدایە لەناونێوەندی رۆشنبیری کوردی ئاینی واباوە کە ابن تیمیە کوردە!! کەچی لە نوسینەکانی بەدیار دەکەوێت زۆر لە ئومەویەکان ڕەگەزپەرستر وعروبی تر بووە، چونکە ابن تیمیە مەسەلەی پەسندی عەرەب دەخاتە قاڵبێکی عەقیدیەوە، بەوپەڕی متمانەوە دەڵێت:

ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعەت لەسەری کۆکن، باوەڕیانە کە ڕەگەزی عەرەب چاکترە لە ڕەگەزی عەجەم [یانی غەیری عەرەب]، لە عیبرانی و سریانی و ڕۆم و فارسەکان و ئەوانیتریش..." (فأن الذي عليه اهل السنة والجماعة اعتقاد ان جنس العرب افضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم ورومهم وفرسهم وغيرهم..)

ئەو چەند لاپەڕەی بەردەستت بەشێکن لە کتێبێکی گەورەتری هەمەلایەنە لەسەر ئیبن تەیمیە کە هیوادارم لە ئایندەیەکی نزیك دەری بکەم. لەبەر گرنگی تەعریب لە سەلەفیەتدا ویستم کچان و کوڕانی نیشتیمان سوود لەو دۆسێیە بە شێوەیەکی سەربەخۆ ببینن، بەڵکو ببێتە سەرەتایەك بۆ خۆ ناسین و خەڵك ناسین، تا هیچیتر چەواشە نەکرێین بە بانگەوازی چەواشەکاران لە ژێر پەرەدەی عاتیفی دینیدا.

هیوادارم سوودی هەبێت

محەمەد هەریری

٢٠١٨/١٢/٧

# ئایە ئیبن تەیمیە کورد بوو؟!

گومانی تێدا نییە ئیبن تەیمیە یەکێکە لە کاریگەرترینی ئەو زانایە دینیانەی کە شوێن پەنجەی خۆی لەسەر کۆی بیرمەند و جوڵانەوە ئیسلامیەکانی دنیا جێهێشتووە، کاریگەری هەتا لەسەر رووداوەکان هەیە، بۆیە بە تایبەتی لای خەڵکانێکی سەلەفی توندڕەو زۆر خۆشەویستە، لای خەلکانێکیش کە مەترسی بیروباوەڕەکانی ئەو دەرك دەکەن تابڵێی بێزراوە! کوردێکی موسڵمان وئیسلامی سەلەفی زۆر دڵ بەوە خۆش دەکەن کە ئیبن تەیمیە کوردە و خەڵکی حەرانە.

ئەوەی یەکەم جار باسی کوردبوونی ئیبن تەیمیەی وروژاند پێموابێت ئیمام محمد ابو زهرة بوو لە کتێبی [ ابن تیمیة، حیاته و عصره – آراؤه و فقهه] ل ١٨، کە دەڵێت: ئەو مێژونووسانەی کە باسیان کردوە، خێزانی ئیبن تەیمیە یان نەداوەتە پاڵ قەبیلەتێك، بەڵکو تەنها دایانەتە پاڵ حەڕان کە شوێنی یەکەمی ژیانی خێزانی بووە، وەك عەرەب نەیانداوەتە پاڵ عەشیرەت وقەبیلەیەك، ئەوەش دەیسەلمێنێت کە عەرەب نەبووە، ونەدراوەتە پال هیچ قەبیلەیەکی عەرەبی، بۆیە دەتوانین تێبگەین و بزانین زانینێکی زەنی، کە عەرەب نەبووە.

لەوانەیە کورد بوو بێت، کە قەومێکی بە هیمەت و ئازا وبە تەنگەوەهاتوون، و ڕەوشتیان بە هێزە و تووندی تێدایە، ئەو سیفەتانە بە ڕوونی لە ئیبن تەیمیە دابوو، هەرچەندە لە ژیان هێمنی زانایان ، و ئاسودەیی بیرمەندان، و لەسەرخۆیی موحەقیقان ژیا بوو. هەروەها کورد لە سەدەی شەشەم و حەوتەم هەڵوێستی جوانیان هەبوو لە بەرگریکردن لە ئیسلام و موسڵمانان، لە بەرەی یەکەمی ئیسلام وەستا بوون لە دژی خاچپەرستان، و زەبری یەکەم بەر ئەوان کەوت، و دوایی چەندین چەپۆکیتریان بەر کەوت، بەڵام بەرەنگاربوونەوەیان خاچپەرستانی بێ ئومێد کرد لە زاڵبوون بەسەر ئیسلامدا. یان بەلایەنی کەمەوە توندئاژۆییەکەیان تێکشکاند وهەیبەتیان نەهێشتن هەتا کورد و دوایی

**میسریەکان بە تێکشکاوی ناردنیانەوە بۆ وڵاتانی خۆیان" دار الفكر العربي، ١٩٧٤، ل ١٨**

**لەوەدەچێت ئیمام ابو زهرة دەستی بە هەموو سەرچاوەیەکی مێژوویی نەگەیشتبێت دەنا سەرجاوەیتر هەیە باسی نەسەبی کردبیت وەك عەرەب!**

**حمدی عبدالمجیدی سەلەفی یش، کە زانایەکی سەلەفی کورد بوو، ئەو قسەیەی ابو زهرە دوبارە دەکاتەوە ودەڵێت ئیبن تەیمیە کوردە چونکە تەنها کورد بەناوی شوێنزادەی، ناوی خۆی دەنێت، بە پێجەوانەی عەرەب کە بەناوی قەبیلەکانیان ناوی خۆیان دەنێن!**

**بەڵام ئەو ئیدیعایە بە دڵی هەموو کەسێك نییە، زۆر بابەت وکۆمێنتم دیوە تا ڕادەی گاڵتە پێکردن بە کورد رەدی کوردبوونی ئیبن تەیمیە دەکەنەوە، زۆرجار عەرەبی سەلەفیم دیوە زۆر بە توندی ئەو ئیدیعایە ڕەت دەکاتەوە.**

**وابزانم بەپێی تێڕوانینی عەرەبی دینی ئیبن تەیمیە یان پێ خەسارە کورد بێت، چونکە وەك سەرنجمان داوە وێنەی کورد لە توراس و کەلەپوری عەرەبی ئیسلامیش تابڵێی وێنەیەکی شێوێندراوە، کورد بەدرێژایی مێژووی عەرەب، بە دەگمەن نەبێت، وتەیەکی باشی لەسەر نەنوسراوە!**

**هەردەم وەك ڕۆڵەکانی زینای نێوان کەنیزەکانی سلێمان پێغەمبەر و جنۆکەکان تەماشایان کراوە، یان وەك میللەتێکی بێ کۆنترۆڵ وخەریك بە دزی وجەردەیی ویاخیبوون وسەرکێشی. وێنەی کورد لە تێڕوانینی عەرەبی زۆر سەرنج راکیشە، بۆیە لە وتارێکی سەربەخۆ باسی دەکەین.**

**سەیر لەوەدایە کە ئیبن تەیمیە شتێکی گووت بە دڵی عەرەب نەبوو دەڵێن کوردە! لە وتارێك بە ناونیشانی [وهم احترام الخصوصيات] نووسەری سعودی منصور النقيدان، هەندێك قسەی ئیبن تەیمیە بە بەڵگە دەهێنێتەوە دژی بەدوەکان کە بە دژی ئیسلامیان دەزانێت! نووسەرێکیتری سعودی خالد الغنامي لە وتاری [الأعراب أشد كفراً ونفاقاً] وەلامی تووندی نووسەر دەداتەوە ودەڵێت: " لقد**

**أخطأ ابن تيمية ( وهو كردي الأصل بحسب رأي الأغلبية الساحقة من الباحثين المستشرقين ) في أنه قرن بين المشركين والأعراب"**

**[ئیبن تەیمیە هەڵەی کردوە (کە کوردە لە ئەسڵدا بەپێی ڕای زۆربەی توێژەران لە ڕۆژهەڵاتناسان) بە بەستنەوەی موشریك و ئەعرابەکان! پێیوایە ئەو ڕەگەزپەرستیە دژی ئەعرابەکان، بەدوەکان فەقیهەکان لە ابن تیمیەیان وەرگرتووە!]**

**ابن ناصرالدين الدمشقي لە کتێبی : التبيان لبديعة البيان، الربعي الدمشقي لە کتێبی: الزيادات دەڵێن عەرەب بووە لە قەبیلەی نمیر بووە!**

**شێخ بکر أبو زیدی سەلەفیش لە کتێبی [المداخل إلى آثار شيخ الإسلام ابن تيمية وما لحقها من أعمال] ل ١٦ دەڵێت:**

**( نسبته النُميري من إفادات تلميذ تلامذته ابن ناصر الدين ( 842 ) ، وتابعه عليها العدوي في الزيارات ، بل هذه النسبة منصوص عليها في بعض رسائل الشيخ المخطوطة على طرر النسخ ، وقد ذكر الشيخ ابن قاسم في مقدمة النقض ، رسالتين رآهما في الظاهريّة كذلك ص 35 حاشية 1 ، وهي نسبة إلى بني نُمير ، وهم بطن من عامر بن صعصعة بن معاوية بن بكر بن هوازن العدنانية ، وذكر القلقشندي في نهاية الأرب ص 433 نقلاً عن ابن خلدون : أن منازل بني نُمير في الجزيرة الفراتية والشام ، فشيخ الإسلام إذاً (عربي صريح نسباً ولساناً ).**

**"نەسەبی ئیبن تەیمیە نومەیریە بەپیی وتەکانی قوتابیەکی قوتابیەکانی ابن ناصر الدين، العدوي یش لە [الزيارات] هەمان شت دەڵێت، بەڵکو ئەو ڕەچەڵەکە لەسەر هەندێ لە نامە دەستنووسەکانی خودی شێخ نووسراوە، وەك شێخ ابن قاسم لە پێشەکی النقض باسی دوو نامیلکە دەکات، کە لە کتێبخانەی یا دەستنوسخانەی الظاهرية بینیونی... بنی نمیر یش بەپێی ابن خلدون شوێنیان دەکەویتە جەزیرەی فورات و شام، کەوابوو شێخی ئیسلام عەرەبێکی بێ گەردە بە نەسەب و بە زمان"**

کەوابوو زۆر سەرچاوە جەخت لەسەر عەرەب بوونی ئیبن تەیمیە دەکەنەوە، لە کاتێکدا هیچ سەرچاوەیەکی کۆن ئاماژە بۆ کوردبوونی ناکات، کۆنترینیانی ئەو کتێبەی ئیمام محمد ابو زهرەی ئەزهەری میسریە کە لە ساڵی ١٩٧٤ چاپ کراوە.
ئەویش سەرەڕای ستایشکردنی کورد وە میللەت، کە ئەوە دەگمەن ڕوودەدات لە نوسراوە عەرەبیەکان، بەلام هەموو بڕیارەکەی لەسەر زەنێك دامەزراندوە، کە ئەوەیش ئەوەیە عەرەب هەردەم نازناوی بەناوی قەبیلەی دەکات، لەبەر ئەوەی زۆربەیان کۆچەر وگەڕۆك و بەدو بوونە، میللەتانیتر نازناوەکانیان بەناوی شار وشارۆجکەکانیان کردوە، جونکە شارستانی تر بونە، چونکە حەرانیش ناوچەیەکی کوردنشین بووە، بۆیە دەبێت ئیبن تەیمیە کورد بێت!
کێشەکە لەوەدایە زانایان وناودارانی کۆنی کورد و میللەتانیتری ناعەرەب، زۆریان لەبەر شانازیان بە ئیسلام کردنەوە نکوڵیان لە میللەتانی خۆیان کردوە، بەدوای بچوکترین بیانوو گەڕاون تا بڵێن عەرەبن! دەتوانم بلێم ئەو وەزعە تا سەد، پەنجا ساڵێکیش هەرمابوو، خێزانە دینیەکان هەردەم ڕەچەڵەکیان دەبردەوە سەر عەرەب، شێخ ڕەزایەکی وازمان تیژیش ئیعتراف بە فەزڵی عەرەب بەسەر غەیری عەرەب دەکات!
ئیبن تەیمیەش هەتا ئەگەر کوردیش بێت دەتوانم بڵێم داڕێژەرێکی هەرە گرنگی تیۆر و داوای باڵادەستی ڕەگەزی عەرەبە، و خۆشەویستی عەرەب وعەرەبچێتی بە بەشێك لە ئیمانی ئەهلی سونە وجەماعەت دەزانێت. لە وتاری داهاتوو باسی تیۆری عەرەبچیەتی ئیبن تەیمیە دەکەین، ئەو کاتە کوردیش بێت، خۆمان دەبێت بڵێین کورد نییە!
من لەبەر یەك شت قەت باوەڕ ناکەم ئیبن تەیمیە کورد بوو بێت، ئەویش ئەوەیە کورد بە گشتی سروشتێکی مرۆیانەتر و نەرم ونیانتری هەبووە لەو سروشتەی توند و شەڕانگێژەی عەرەب و ئیبن تەیمیە. کورد سەدان عاریف و حەکیمی وەك شێخی گەیلانی و سوهروەردی و مەحوی و مەولانا خالید و نورسی تیادا

هەڵکەوتوە، کە تەژی بوون لە مرۆدۆستی، هەتا پیاوێکی عەسکەری مەزنی وەك سەلاحەدینی ئەیووبی، سەرەڕای ئەوەی ژیانی هەموو لەناو شەڕ وشۆڕی ناوەکی ودەرەکی بوو، هەرچەندە بێ هەڵەش نەبوە وکەسیش نابێ، بەڵام میهرەبانی و مرۆیی سەلاّحەدین بە هیچ مونسفێك و دادپەروەرێك نکوڵی لێناکرێت، ئەوروپای سەردەمی خاچپەرستیش دانی پیادا هێناوە!

نەرم و نیانی و شەهامەت و مرۆدۆستی ئەو زۆرجار سنوورەکانی ئیسلامیشی تێدەپەڕاند، لە ڕەفتاری لەگەل دوژمن و دیلەکان و مەدەنیەکان، هەزاران کچ وژنی جوانی ئەوروپایی خاچپەرستانیان دەست دەکەوت، بەو پەڕی ڕێزەوە مامەڵەی دەکردن و ئازادی دەکردن! بەڵام بەپێی رای ئیبن تەیمیە بێت، ئەوانە هەموویان دەبێت دابەش بکرێن بەسەر موجاهیدان، وەك داعش و توندرەوانیتر پەیڕەو لە ئیبن تەیمیە دەکەن لە ڕەفتارە توندوتیژەکانیان.

# ئیبن تەیمیە و سەلەفیەتی عەرەباندن

## بەشی یەکەم

لە وتارێکدا باسی ئەگەری کورد بوون و نەبوونی ئیبن تەیمیە مان کرد، کە گەیشتینە ئەو ئەنجامەی ناکرێت ئیبن تەیمیە کورد بێت، بەڵام وامان دانا کوردیش بوو، وەرە با پێکەوە بروانینە ئەو تیۆرە توندو تۆڵەی عەرەباندنی ئیسلام و موسڵمانان، وەك بڵێیت بەو کارەی ڕەتی ئەوە بکاتەوە کە ئیسلام بۆ هەموو میللەتانێك هاتبێت، وەك دەیان دەقی قورئان و حەدیس جەختی لەسەر دەکەنەوە.

ئیبن تەیمیە بە بیروڕاکانی، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئیسلام تەنها بۆ عەرەب هاتووە، ئەوەشی عەرەب نەبێت دەبێت خۆی تەعریب بکات تاوەکوو ببێتە موسڵمانێکی نموونەیی!

ئیبن تەیمیە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی لە دامەزرێنەرانی بەرایی سەلەفیەت وەرگرتووە، کە دەیسەلمێنێت ئەو سەلەفیەتە پیشەسازیەکی ئومەوییە، ولەبەر عەرەبچیەتی ئومەوییەکانیش ئاینەکە بە دەستی ئەو تیۆرە سەلەفیە سەقەتەی ئومەوی، بەرەو ڕەگەز پەرستی هەنگاویان پێی ناوە بە ناوی دین وسەلەفی سالح.

هەر ئەو بیرۆکەیەشە بۆتە هۆی فریودانی ژمارەیەکی زۆری کوردی سەلەفی وهەتا غەیری سەلەفیش، بۆ بایەخدان بە زمانی عەرەبی زیاتر لە کوردی، و وازهێنان لە زمانی زگماگی خۆیان وپشتگوێ خستنی وقسەکردن لەگەڵ منداڵەکانیان بە عەرەبی و هەتا ناونانیان تەنها بە عەرەبی!!

بێگومان بەپێی کتێبەکەی ابن تیمیە (اقتضاء الصراط المستقیم) کە سانێك لەوانەی پێیان دەڵێن سەلەفی سالح یش لە سەحابە وتابعی وئەئیمەکان کەوتونەتە داوای ئەو عروبەتەی ئومەوییەکان وەك لەو بەشەی کتێبەی بە ناوی (أعمال الكفار والأعاجم ونحوهم تنقسم إلى ثلاثة أقسام) هەتا ڕیوایەتێکی داوەتە

**پاڵ خودی پێغەمبەر (د.خ) گوایە نەهی کردوە کەسانێك ئەگەر عەرەبی بزانن بە زمانێکی عەجەمی واتە غەیرە عەرەبی قسە بکەن، بۆ؟! چونکە دەبێتە هۆی دروست بوونی نیفاق!! (.. عن نافع عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: " قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: من يحسن أن يتكلم بالعربية فلا يتكلم بالعجمية فإنه يورث النفاق) .**

**من نازانم زمان پەیوەندی چیە بە ئیمان و نیفاق، هەزاران کەسی عەرەبی نەزان هەن، چاکترین موسڵمانن بە پێوەری ئیسلام، لەکاتێکدا هەزارەها وملیۆنەها عەرەبی زمان هەن ئیسلامیان خۆش ناوێت لە دڵی خۆیان وکەچی نیشانیشی نادەن، وسەدان ملیۆن عەرەبی نەزانیش وەك کورد وئەفغانی وهیندی وپاکستانی وئەندەنوسی وبەنگلادیشی، حەرفێك عەرەبی نازانن کەچی بە دڵسۆزی پەیڕەو لە ئیسلام دەکەن، ئامادەن گیان وماڵیشیان ببەخشن لە پێناویدا:**

**پایەکانی تیوری عروباندنی ئیسلام یەکە یەکە باس دەکەین تا ببینین کە هیچ زانایەکی عەرەبی ڕەسەنیش، نەك وەك ئیبن تەیمیە کێشە لەسەر، هێندە خزمەتی عەرەباتی نەکردوە!**

# *قسەکردن بە عەرەبی عەقڵ و دین و ڕەوشت زیاد دەکەن!

زانراوە کە ڕاهاتن لەسەر قسەکردن بە غەیری زمانی عەرەبی تا دەبێتە عادەت، کارێکی شەرعی نییە جونکە دەبێتە هۆی خۆشەویستی خاوەنی ئەو زمانانە لە کافرەکان، ئەوەش پێچەوانەی عەقیدەی وەلا و بەرا یە وەك ئیبن تەیمیە دەڵێت: "بزانە ڕاهاتن بە زمانێك زۆر بە تووندی و ئاشکرا کاردەکاتە سەر عەقڵ و ڕەوشت و دین، کاریش دەکاتە سەر پێچوون بە بەرایەکانی ئەو ئومەتە لە ئەسحابە و تابیعیەکان، پێچوون بە وانیش عەقڵ و دین و ڕەوشت زیاد دەکەن" ل ٢٠٧

"ومعلوم أن اعتياد التكلم بغير العربية حتى يكون عادة أمر غير مشروع لأن يورث محبة أهل تلك اللغة من الكفرة وهو مخالف لعقيدة الولاء والبراء من الكفار. قال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله : (واعلم أن اعتياد اللغة يؤثر في العقل والخلق والدين تأثيرًا قـويًا بينًا، ويـؤثر أيضاً في مشابهة صدر هذه الأمة من الصحابة والتابعين ، ومشابهتهم تزيد في العقل والدين والخلق" ص ٢٠٧

# *تەعریبی خەڵکانی نا عەرەب و راهێنانیان لەسەر عەرەبی ئاخاوتن

ابن تیمیە دان بەوەدا دەنێت کە ئەو جۆرە سیاسەتە عەرەبیە بۆتە هۆی بە عەرەبکردنی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ئەو وڵاتانەی کە هاتنە ناو ئیسلامەوە، لەوبارەیەوە دەڵێت:

**(وأما اعتياد الخطاب بغير اللغة العربية، التي هي شعار الإسلام ولغة القرآن حتى يصير ذلك عادة للمصر وأهله، أو لأهل الدار، للرجل مع صاحبه، أو لأهل السوق، أو للأمراء، أو لأهل الديوان، أو لأهل الفقه، فلا ريب أن هذا مكروه فإنه من التشبه بالأعاجم، وهو مكروه كما تقدم، ولهذا كان المسلمون المتقدمون لما سكنوا أرض الشام ومصر، وأهلهما رومية، وأرض العراق وخراسان ولغة أهلهما فارسية، وأهل المغرب، ولغة أهلها بربرية - عودوا أهل هذه البلاد العربية، حتى غلبت على أهل هذه الأمصار: مسلمهم وكافرهم...) اقتضاء الصراط المستقيم، ص ٢٠٦.**

(لێڕاهاتنی ئاخاوتن بە غەیری زمانی عەرەبی، کە دروشمی ئیسلامە وزمانی قورئانە تا ئەو کاتەی دەبێتە زمانی ئەو شارە وخەڵکەکەی، وزمانی ئاخاوتنی ماڵەوە ونێوان هاوڕێیان، وزمانی خەڵکی بازاڕەکان، وفەرمانرەوایەکان، و خەڵکی دەربار ودیوانەکان (فەرمانگەکان) وئەهلی فیقە، گومانی تێدا نیە کە مەکروهە وەك باسکرا! بۆیە موسڵمانەکانی بەرایی کاتێك لە خاکی شام ومیسر نیشتەجێ بوون کە خەڵکەکەی رۆمی بوون، ولە عێراق وخوراسانیش کە زمانی خەڵکەکەی فارسی بوو، ولە مەغریب کە زمانی خەڵکەکەی بەربەری بوو، خەڵکی ئەو وڵاتانەیان لەسەر ئاخاوتنی عەرەبی ڕاهێنا، هەتا زاڵ بوو بەسەر زمانی موسڵمان وکافرەکانیان)

# *تەنها لە ناچاری جایزە بە غەیری عەرەبی بدوێی!

ئەو هەموو زمانەی جیهان، کە قورئانیش بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی خوای دادەنێت، لای ئیبن تەیمیە زمانی یەدەکی عەرەبین، بۆیە ئیبن تەیمیە زۆر لە خۆی دەکات تا بە ناچاری دەڵێت: " کە جایزە بە زمانی تر بدوێی بەڵام سەلەف ڕێگایان پێدا بۆ پێویستی، وپێیان خراپە لە کاتی نا پێویستیدا قسەی پێ بکرێت، بۆ پاراستنی شەعیرەکانی ئیسلام، چونکە خوا کتیبەکەی بە عەرەبی دابەزاندوە بۆ پێغەمبەرە عەرەبەکەی ونەتەوەی عەرەبیشی بە چاکترین نەتەوە دانا، بۆیە پاراستنی ئەو دروشمانەی عەرەب لە پاراستنی ئیسلام دایە."

"مَعَ أنّ سَائِرَ الْأَلْسُنِ يَجُوزُ النُّطْقُ بِهَا لِأَصْحَابِهَا؛ وَلَكِنْ سَوَّغُوهَا لِلْحَاجَةِ وَكَرِهُوهَا لِغَيْرِ الْحَاجَةِ وَلِحِفْظِ شَعَائِرِ الْإِسْلَامِ؛ فَإِنّ اللّهَ أَنْزَلَ كِتَابَهُ بِاللّسَانِ الْعَرَبِيّ وَبَعَثَ بِهِ نَبِيّهُ الْعَرَبِيّ وَجَعَلَ الْأُمّةَ الْعَرَبِيّةَ خَيْرَ الْأُمَمِ فَصَارَ حِفْظُ شِعَارِهِمْ مِنْ تَمَامِ حِفْظِ الْإِسْلَامِ" مجموع الفتاوى (32 / 255)

ئینجا پاش کاردانەوەی گەلان بۆ ئەو سیاسەتە تەعریبە و ڕەگەزپەرستیەی ئومەویەکان، خەڵکی بەرەنگاری تەعریبکردنیان کرد، ودەستیان بە زمانی خۆیانەوە گرت هەرچەندە زۆربەیان ئیسلامیشیان قبوڵ کرد، تا ناچاریان کردن فاتیحە نوێکان بەزمانی خۆیان بدوێن لەناو وڵاتەکانیان، حاڵەکە بەوە گەیشت کە ابن تیمیە وا باسی دەکات:

(ثم إنهم تساهلوا في أمر اللغة، واعتادوا الخطاب بالفارسية، حتى غلبت عليهم، وصارت العربية مهجورة عند كثير منهم، ولا ريب أن هذا مكروه، إنما الطريق الحسن اعتياد الخطاب بالعربية، حتى يتلقنها الصغار في المكاتب وفي الدور فيظهر شعار الإسلام وأهله، ويكون ذلك أسهل على أهل الإسلام في فقه معاني الكتاب والسنة وكلام السلف...)

**(ئینجا خەمساردیان کرد لە بابەتی زمان، وفێری ئاخاوتن بوون بە فارسی، تا زاڵ بوو بەسەریان، زمانی عەرەبی لەلایەن کەسانێکی زۆر وازی لێهێنرا، ئەوەش بێگومان مەکروهە، چونکە ڕێگای چاك ڕاهاتنە لەسەر ئاخاوتن بەعەرەبی، هەتا منداڵان لە حوجرەکانیش فێری دەبن بۆ نیشاندانی دروشمی ئیسلام وخەڵکەکەی، ئەوەش ئاسانترە بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئان وسونەت وقسەی سەلەفی سالح)**

# بەشی دووەم

# لای هەموو ئیمامەکانی مەزهەبەکان

# نابێت بە غەیری عەرەبی بدوێیت بۆ ناچاری نەبێت!

**وەك ابن تەیمیە لە مجموع الفتاوی دەگێڕێتەوە:**

**"هەمیشە سەلەف ڕقیان لە گۆڕینی ڕێوشوێن و نەریتی عەرەبە هەتا لە مامەڵەکردنیش، وەك [قسەکردن بە غەیری زمانی عەرەبی] تەنها لەبەر پێویستی وناچاری بێت وەك مالیك و شافیعی و ئەحمەد وایان نووسیوە، بەڵکو مالیك دەڵێت: ئەوەی لە مزگەوتی ئێمە بە زمانێك جگە لە عەرەبی قسەی کرد، وەدەردەنرێت!"**

**" وَمَا زَالَ السَّلَفُ يَكْرَهُونَ تَغْيِيرَ شَعَائِرِ الْعَرَبِ حَتَّى فِي الْمُعَامَلَاتِ وَهُوَ " التَّكَلُّم بِغَيْرِ الْعَرَبِيَّةِ " إلَّا لِحَاجَةِ كَمَا نَصَّ عَلَى ذَلِكَ مَالِك وَالشَّافِعِيُّ وَأَحْمَد بَلْ قَالَ مَالِك: مَنْ تَكَلَّمَ فِي مَسْجِدِنَا بِغَيْرِ الْعَرَبِيَّةِ أُخْرِجَ مِنْهُ. مجموع الفتاوی (32 / 255)**

**جا بزانە مرۆڤی سەلەفی لە ژێر چ فشارێك دەبێت بۆ فێربوونی عەرەبی، و خۆداشۆرین لە زمان و کلتور ونەتەوە و داب ونەریتی خۆی! بۆیەش دەیانبینی زۆربەیان پێیان شەرمە خۆیان خەریك کەن بە زمانی کوردی، کە قسە دەکەن دەڵێی عەرەبێکی تازە فێری کوردی بوون! هەتا ئەگەر هەندێ بایەخیش بە زمانی کوردی بدەن لە پێناو ئەوەیە بانگەوازی بیری سەلەفیەتی پێ بکەن بۆ ئەوانەی تەنها کوردی دەزانن، هەرکە هاتنە ناو سەلەفیەت یەکسەر هەوڵی بایەخدان و فێربوونی عەرەبی دەدەن، کوردیەکەیان فەرامۆش دەکەن!**

# *عەرەب لە هەموو میللەتان باشترن بەپێی ئەهلی سونە وجەماعەت!

سەیر لەوەدایە لەناو نێوەندی رۆشنبیری کوردی ئاینی واباوە کە ابن تیمیە کورد بووە!! کەچی لە نوسینەکانی بەدیار دەکەوێت زۆر لە ئومەویەکان رەگەزپەرستر وعروبی تر بووە، چونکە ابن تیمیە مەسەلەی خۆشەویستی و پەسندانی عەرەب بەسەر میلەتانیتری موسڵمان دەخاتە قاڵبێکی عەقیدیەوە، وپڕ بەدەم دەڵێت:

"ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعەت لەسەری کۆکن، باوەڕیانە کە ڕەگەزی عەرەب چاکترە لە ڕەگەزی عەجەم [یانی غەیری عەرەب]، لە عیبرانی و سریانی و ڕۆم و فارسەکان و ئەوانیتریش..." (فأن الذي عليه اهل السنة والجماعة اعتقاد ان جنس العرب افضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم وورومهم وفرسهم وغيرهم..) مجموع الفتاوى (19/29ـ30)، لە (اقتضاء الصراط المستقيم) یش هاتوە.

هەر لە دەقێکیتردا ئیبن تەیمیە دەڵێت: "بەنی هاشم چاکترین خانەوادەی قورەیشە، قورەیشیش چاکترین هۆزی عەرەبە، عەرەبیش چاکترین میللەتی بەنیادەمن!"

"إن بني هاشم أفضلُ قريش، وقريشاً أفضلُ العرب، والعربُ أفضل بني آدم"
مجموع الفتاوى :(27|472)

من نازانم ئیبن تەیمیە و ئەهلی سونە و جەماعە ئەو قەولەیان لە کوێ هێناوە لە کاتێکدا قورئان بە ڕاشکاوی دەڵێت: (ان اكرمكم عند الله اتقاكم) وحەدیسی سەریحی پێغەمبەر هەیە دەڵێ [لافرق بين عربي واعجمي الا بالتقوى] وچەندین دەقیتر!

**ئەو هەڵەیە دەکرێت چاوەڕوان کراو بێت بۆ میشێل عەفلەق وشبل العیسمي و هەتا بۆ محمـد عمارەش، بەڵام بۆ فەرمودەناسێکی شارەزای وەك ابن تیمیە هیچ عوزرێکی بۆ نییە!! بەڕاستی توانیان پەیامی ئیسلام بە ئاڕاستەی ئەو عروبەتە ببەن! خاوەنی وتاری عروبی لە سەلەفی ساڵح، توانیان قورئان لە زۆر ڕووەوە لە مانای خۆی بەتاڵی کەنەوە، وەك چۆن لە پەیامێکی گشتی کردیان پەیامێکی تایبەتی ڕەگەزی عروبی! هەروەها چۆن بەتاڵیان کردەوە لە پەیامی ئاشتی وئازادی بیروڕا و عەقیدە، هەروەها لە پەیامێکی ئاشتی بۆ پەیامێکی شەڕانگێژی بێ سنور وبێ کۆتا.**

## *ئەوەی بە عەرەبی قسەی کرد عەرەبە!

بە پێی ئەو چەمکە عروبەت پەیوەندی بە خوێن ونەسەب نیە بەڵکو زمانە، هەرکەسەی بە عەرەبی دوا ئەوە عەرەبە! حەدیسێك لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە لە چەندین سەرچاوە بە لاواز وزەعیف دەستنیشان کراوە دەڵێت: خوا یەکە، باوك یەکە، دینیش یەکە، عەرەبی بوون بە دایك وباوك نییە، بەڵکو بە زمانە ئەوەی بە عەرەبی قسەی کرد عەرەبە!

عن مالك بن أنس، عن الزهري، عن أبي سلمة بن عبد الرحمن قال: قام النبي صلى الله عليه وسلم... قال: " أما بعد: أيها الناس، فإن الرب رب واحد، والأب أب واحد، والدين دين واحد، وإن العربية ليست لأحدكم بأب ولا أم، إنما هي لسان، فمن تكلم بالعربية فهو عربي "

ابن تیمیە لە کۆمێنتی خۆیدا دەڵێت: ئەوە حەدیسێکی لاوازە بۆ مالیك هەڵبەستراوە، بەڵام لە ڕووی مانادا دوور نیە، بەڵکو ڕاستە لە هەندێ ڕووەوە!! " هذا الحديث ضعيف، وكأنه مركب على مالك لكن معناه ليس ببعيد، بل هو صحيح من بعض الوجوه " اقتضاء الصراط المستقيم 410

تۆ ببینە وەك دوژمن باسی حەدیسی هەڵبەستراو و لاواز دەکات، بەڵام چونکە ئەو حەدیسە لەگەڵ هەوای عروبی خۆی دێتەوە، دەڵێ ڕاستە ماناکەی! هەرچەندە حەدیسی زۆر مانادار هەیە پڕ لە مرۆدۆستی و زانست ئیبن تەیمیە و ئەهلی حەدیس بە بیانووی زەعیف بوونی ڕەتی دەکەنەوە! بەڵێ دوور نیە لە چەمکی سەلەفیەتی عروبەتی ئومەوی بە بڕوای ئیبن تەیمیە، بەڵام دەبوایە شێخی ئیسلام بیزانیبایە کە دورە لە چەمکەکانی قورئان!

ئەوەش چەمکی سەرەکی ئومەویەکان بوو بۆ تەعریب کردنێکی پەردەپۆش کراو بە دین، کە لەبەر ساویلکەیی ئایینی وژیاری، زۆر میللەتانیان بە ئاسانی تواندەوە لە ناو عروبەت وئەمڕۆ بونەتە رەسید و زەخیرە بۆ عروبەت نەك بۆ ئیسلام!

# *پشت بەستن هەتا بە حەدیسگەلێکی هەڵبەستراو و مەوزوع بۆ ستایشی عروبەت!

ئینجا ابن تیمیه سەدان ئەقوال دەگوازێتەوە لە ئیمامەکانی ئەهلی سونە، بۆ سەلماندنی ئەو مەقولەیەی کە ڕەگەزی عەرەب لە هەموو ڕەگەزەکانی تر چاکترە، وکە لە ئەنجامدا دەگاتە ئەو ڕایەی کە زمانی عەرەبیش لە هەموو زمانەکانی تر چاکترە، تا ئەو بیرۆکەیە کە زۆر ئاشکرا پێچەوانەی قورئان دەکات دەبێتە ئەسڵێك لە ئسوڵەکانی ئەهلی سونە وجەماعەت. سەیر لەوەدایە کە ابن تیمیەی شارەزا لە قورئان ومەوسوعە لە فەرمودەزانی، چۆن ئەو بیرۆکە ڕەگەزپەرستییەی بەسەردا تێدەپەڕێت؟! وا بە ئاسانی ئەو فەرمودانە دەهێنێتەوە کە بچوکترین موحەدیس دەزانێت سەحیح نین وهەڵبەستراون! بۆ چاوی وا تیژە بۆ شەڕی مەزهەبی شیعە وسۆفیەکان و بە قەولی خۆی بیدعەچیەکان، کەچی وا بێ نەزەرە لە ئاست ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانەی عروبەتی ئومەویەت؟!

وەلامەکەی دەیسەلمێنێت، کە ئەو سەلەفیەتە پیشەسازیەکی ئومەوییە، ولەبەر عەرەبچیەتی ئومەوییەکانیش ئاینەکە بە دەستی ئەو تیۆرە سەلەفیە سەقەتەی ئومەوی بەرەو ڕەگەزپەرستی هەنگاویان پێی ناوە، بە ناوی دین وسەلەفی سالح. هەر ئەو بیرۆکەیەشە بۆتە هۆی فریودانی ژمارەیەکی زۆری کوردی سەلەفی وهەتا غەیری سەلەفیش، بۆ فەرامۆش کردنی زمانی خۆیان بۆ وازهێنان لە زمان و ئەدەبیاتی زگماکی خۆیان، کە سەردەکێشێت بۆ وازهێنان لە بایەخدان بە کێشە هەقیقیەکانی نەتەوەکەیان و کردنیان بە دوژمنی خەونە نەتەوەییەکانیان، وخەرجکردنی توانا وهێزیان بۆ خزمەتی پڕۆژەیەکی عەرەبی پەردەپۆشکراو بە دین و سەلەفیەت!!

هەر لە کارخانەیەی ئومەویەکاندا ئیبن تەیمیە دەیان فەرمودەی ساختە و هەڵبەستراویان بەسەر خەڵك تێپەڕاند کە هەموویان دەستنیشان کراون بە حەدیسی هەڵبەستراو ومەوزوع لە جۆری:

عەرەبتان خۆش بوێ لەبەر سێ هۆ: چونکە من عەرەبم، قورئان عەرەبیە، وزمانی بەهەشتیش عەرەبیە! [أحبوا العرب لثلاث لأني عربي ، والقرآن عربي ، وكلام أهل الجنة عربي.]

حەزتان بە مانەوەی عەرەب بێت، مانەوەیان نور ورۆناکیە بۆ ئیسلام، ولەناوچونیانیش لەناوچوونی ئیسلامە. [أحبوا العرب وبقاءهم، فإن بقاءهم نور الإسلام وإن فناءهم فناء الإسلام]

ئەگەر عەرەب زەلیل بوو، ئیسلام زەلیل دەبێت[إذا ذل العرب ذل الإسلام]. کەس ڕقی لە عەرەب نابێتەوە ئەگەر مونافیق ودوو ڕوو نەبیت [لا يبغض العرب إلا منافق]. خۆشەویستی عەرەب لە باوەردایە، ورقیشیان لە نیفاقەوەیە. [حب العرب إيمان وبغضهم نفاق]. ئیماندار ڕقی لە عەرەب نابێتەوە [لا يبغض العرب مؤمن]

من گومانم نییە لە هەڵبەستراوی ئەو حەدیسانە، کە بلیمەتێکی فەرمودەناسی وەك ابن تیمیە چاویان لێ ئەنوقێنێ، ولەجیاتی بڵێت هەڵبەستراون، بە بەڵگە دەیان هێنێتەوە بۆ سەلماندنی چەمکی عروبەتی ئومەوی، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانە لە ئەنجامی کاردانەوە دژی توخمە نا عەرەبیەکانەوە هاتوە، لە دژی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی وتەعریبی ئومەوی، کە لەوە دەچێت خەڵکی ناعەرەب وەك کاردانەوەیەك ڕقیان لە عەرەب بوبێتەوە، کە لەو کاتە ناهەقیان نەبووە بەرامبەر ئەو هەموو هەڵمەتە عەرەبچێتییە وا کاردانەوەیان کردبێت.

بەڵام کە ئێمە ئەو باسە دەکەین هەرگیز هانی خەڵك نادەین کە ڕقیان لە عەرەب بێتەوە، وەك ئەو ڕقە مێژووییەی ئێرانیەکان وفارسەکان بە تایبەتی، بەڵام بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی کوردە کە ئیسلامبوون هیچ مانای بە عەرەب بوون ناگەیەنێت، ونابێت ئەو هەموو کارەساتە مێژوویانە وا بە ئاسانی لە بیر کەین ووانە وپەندیان لێ وەرنەگرین.

# ئیبن تەیمیە و سەلەفیەتی عروبەت

# بەشی سێیەم

# *پەسندی عەرەب لە ئسوڵی ئیعتیقادە!

کاریگەری ئەو تەفزیلکردنەی عەرەب و عروبەت هەر لەناو ڕێکخراو و گروپ و کۆمەلە و فیکری سەلەفیەکاندا نیە تەنها، بەڵکو ئیمامی هەرە گەورەی ئیخوانەکان شێخ یوسف قەرزاوی لە کۆنگرەی نەتەوەیی ئیسلامی لە دۆحە لە مانگی دیسەمبەری ٢٠٠٦ گووتی: "من يريد أن يفصل بين العروبة و الإسلام كمن يريد أن يفصل بين الروح و الجسد؟ فعلينا بإسلام عربي و بعروبة إسلامية" [ئەوەی دەیەوێت عروبەت و ئیسلام لێك جیاکاتەوە وەك ئەوە وایە ڕوح و جەستە لێك جیاکاتەوە! بۆیە با دەستگرین بە ئیسلامێکی عەرەبی و عروبەتێکی ئیسلامی!]

بێگومان ئەوەش هەڵوێستێکی نوێی قەرەزاوی نییە کە سەرەڕای ئەوەی [یحمل اسفارا] چەندین بارە کتێبی لە خۆی ناوە، بەڵام نەوێراوە لە هیچ بوارێکی گرنگ نوێکاریەك بکات، بەڵکو ئەو عەوبەچیەتیەی لە سەلەفیەتی ئومەوی کۆن و لە ئیخوان و حسن البنا وەرگرتوە. حەسەن بەنا لە رسالة (دعوتنا في طور جديد) عەرەب بە گەلی هەڵبژاردەی خوا دادەنێت وەك چۆن جوو خۆیان بە شعب الله المختار دادەنێن و دەربارەی ئەو پەیوەندیە دەڵێت: " عروبەت پایەکی بەرجەستە و بەشێکی گەورەی هەیە لە دەعوەکەمان، چونکە عەرەب ئومەتی یەکەمی ئیسلامن، و گەلی هەڵبژێردراوی ئیسلامن، و ئیسلامیش ڕانابێتەوە بەبێ هاودەنگی گەلانی عەرەب و ڕابوونیان، هەر بستێك لە خاکی نیشتیمانی عەرەب بە ناوجەرگەی وڵاتی خۆمانی دەزانین.."

**"والعروبة لها في دعوتنا مكانُها البارز وحظُّها الوافِر، فالعَرَب هم أمة الإسلام الأولى، وشعبه المختار، ولن ينهض الإسلام بغير اجتماع كلمة الشعوب العربية ونهضتها، وإن شبر أرض في وطن عربي نعتبره من صميم أرضنا ومن لباب وطننا"**

**ئینجا لە هەمان سەرچاوە دەڵێت: " ئێمە پێمان وایە کاتێ بۆ عروبەت کار دەکەین بۆ ئیسلام و خێری هەموو جیهان کار دەکەین"**

**"ونحن نعتقد أننا حين نعمل للعروبة نعمل للإسلام ولخير العالم كله."**

**لە جیگایەکی تر سنوری هەموو جیهانی ئیسلامی لێ دەبێتە سنوری ئومەتی عەرەبی وەك ئیبن تەیمیەش وای گووت، لە ئەڵقەی دووەم ئاماژەمان پێدا، ودەڵێت: عروبەت سیفەتێکە بۆ هەموو موسڵمانێك بە زمانی عەرەبی بدوێت، چونکە عروبەت زمان و ئیسلامە، ڕەگەزنامەی جوگرافی نییە، چونکە ئومەتی عەرەبی بە سنوری جوگرافی نازانرێت، بەڵکو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە دین و زماندا دەزانرێت ودەناسرێت"**

**وفي تعليق للإمام" البنا "على حديث لشيخ الأزهر عن "القبّعة في الجيش" يرى أن العمامة شعار العروبة، والعروبة صفة لكل مسلم ينطق اللسان العربي، فالعروبة اللسان والإسلام، وليست تجنُّسًا جغرافيًّا، فالأمة العربية لا تُعرف بالحدود الجغرافية، وإنما إسلاميًّا تُعرف بالدين واللغة .**

**لە کۆمێنکیدا لەسەر قسەی [ساطع الحصري] وەك ڕابەرێکی فیکری عروبەت دەربارەی جیاوازی عروبەت لە ئیسلامدا، سەید قوتب دەڵێت: ئەو قسەیە ئاماژە بە نەزانیەکی قووڵ دەکات بە ئیسلام و عروبەتدا!**

**على كلام "ساطع الحصري"- عن انفصال العروبة عن الإسلام -بأن ذلك يكشف عن جهل عميق؛ سواء عن الإسلام أو العروبة .**

http://www.ikhwanwiki.com/index.php?title=%D9%85%D9%88%D9%82%D9%81_%D8%A7%D9%84%D8%A5%D8%AE%D9%88%D8%A7%D9%86_%D9%85%D9%86_%D8%A7%D9%84%D8%B9%D8%B1%D9%88%D8%A8%D8%A9

ئەو قسانەی دەیسەلمێنێت میانڕەوترین ڕەوتی ئیسلامی لە ژێر کاریگەری عروبەتدایە زۆر لە سەلەفیەتەکە بە پەرۆشترە بۆ عروبادنی ئیسلام و موسڵمانان، بەڵکو عروبەتیان کردۆتە ڕوکنی شەشەمی ئیسلام!

ئیبن تەیمیە لە دەقێکدا هەر لە کتێبی اقتضاء پەسندی عەرەب و بە باشترین زانینی ئەوان دەکاتە ئەسڵێك لە ئسوڵی ئیعتیقاد لە ئیسلامدا، دەڵێت:

"عەرەب لەبەر چاکی خەسڵەتەکانیان ئیسلام لە نێو ئەواندا دەرکەوت، خودا پێغەمبەرەکەی، محەمەدی لەنێو ئەواندا هەڵبژارد، چونکە پێغەمبەرایەتی لە تۆرەمە و پشتیان بوو، بوونە هەڵبژاردەی خوا بۆ هەڵگرتن و بڵاوکردنەوەی پەیامی یەکەمینی خوا، و چاکی وپەسندی ئەوان بەسەر غەیری خۆیان بوە بنەمایەك لە بنەماکانی بیروباوەڕ لە ئیسلامدا"!

"ولفاضل مزاياهم ظهر الاسلام فيهم، واصطفى الله نبيه و رسوله محمدا منهم فكانت النبوة من اصلابهم، وترشحوا حملة نشر الرسالة الاول، وصار اعتقاد فضلهم على غيرهم من اصول الاعتقاد في الاسلام."

اقتضاء الصراط المستقيم، ص ١٦٦-١٦٧.

# عەرەب باشترین نەتەوە نین

# چونکە پێغەمبەریان تێدایە، بەڵکو لە خودی خۆیان باشترینن!

ئیبن تەیمیە عروبەچیەتەکەی هێندە بەرزدەبێتەوە، و تا رادەی ئەوەی دەڵێت عەرەب بەخۆیان چاکترین ئومەتن نەك لەبەر خاتری پێغەمبەر کە لەواندایە! یانی پێغەمبەریش نەبا عەرەب هەر ئەفزەڵ وچاکترین دەبوون!

ئیبن تەیمیە دەڵێت: "ئەوەی ئەهلی سونە و جەماعەت لەسەری کۆکن، باوەڕیانە کە ڕەگەزی عەرەب چاکترە لە ڕەگەزی عەجەم [یانی غەیری عەرەب]، لە عیبرانی و سریانی و ڕۆم و فارسەکان و ئەوانیتریش، هەروەها قورەیش چاکترینی عەرەبە، بەنی هاشمیش چاکترینی قوڕەیشە، و پیغەمبەر [د.خ] چاکترینی بەنی هاشمە، ئەو چاکترین خەلقی خوایە و باشترین نەسەبیشی هەیە. پەسندی وچاکترینی عەرەب و قوڕەیش و بەنی هاشم تەنها لەبەر بوونی پێغەمبەر لەوان نییە، هەرچەندە ئەوەش فەزڵە، بەڵکو ئەوان خۆیان چاکترین و ئەفزەڵن لە خودی خۆیاندا..."

قال شيخ الإسلام ابن تيمية " فإن الذي عليه أهل السنة والجماعة اعتقاد أن جنس العرب أفضل من جنس العجم :عبرانيهم وسريانيهم، رومهم و فرسهم وغيرهم، وأن قريشاً أفضل العرب وأن بني هاشم أفضل قريش وأن رسول الله (ص) أفضل بني هاشم، فهو أفضل الخلق نفساً وأفضلهم نسباً. وليس فضل العرب ثم قريش ثم بني هاشم بمجرد كون النبي (ص (منهم، وإن كان هذا من الفضل، بل هم أنفسهم أفضل."

اقتضاء الصراط المستقيم ١٤٨-١٤٩

**هەر لە دەقەکەی پیشوداش هەمان شت دەڵێت:**

**"عەرەب لەبەر چاکی خەسڵەتەکانیان ئیسلام لە نێو ئەواندا دەرکەوت، خودا پێغەمبەرەکەی، محەممەدی لەنێو ئەواندا هەڵبژارد، چونکە پێغەمبەرایەتی لە تۆرەمە و پشتیان بوو، بوونە هەڵبژاردەی خوا بۆ هەڵگرتن و بڵاوکردنەوەی پەیامی یەکەمینی خوا، و چاکی وپەسندی ئەوان بەسەر غەیری خۆیان بوە بنەمایەك لە بنەماکانی بیروباوەڕ لە ئیسلامدا"!**

**"ولفاضل مزاياهم ظهر الاسلام فيهم، واصطفى الله نبيه و رسوله محمـدا منهم فكانت النبوة من اصلابهم، وترشحوا حملة نشر الرسالة الاول، وصار اعتقاد فضلهم على غيرهم من اصول الاعتقاد في الاسلام."**

**اقتضاء الصراط المستقيم، ص ١٦٦-١٦٧.**

**وەك دەبینیت لای ئیبن تەیمیە عەرەب چاکترین میللەت نین لەبەرئەوەی پێغەمبەر لەناو ئەوان دەرکەوتوون، بەڵکوو عەرەب "عەرەب لەبەر چاکی خەسڵەتەکانیان پیغەمبەر و ئیسلام لە نێو ئەواندا دەرکەوت" دەمارگرژترین عروبەتچی فەزڵی عەرەبی بەسەر پیغەمبەر و ئیسلامدا نەداوە، و هەردەم گوتویانە لەبەر فەزڵی پێغەمبەر عەرەب فەزڵیان هەیە، کەچی لای ئیبن تەیمیە عەرەب چاکترین نین لەبەرئەوەی پێغەمبەر لەناو ئەواندا هەڵکەوتوە، بەڵکوو لەبەر چاکی خۆیان پێغەمبەر لەناویان پەیدا بوە! وەڵلا نازانم پیش ئیسلام دەبێت چاکی عەرەب لە چیدا بوو بێت؟! لە پێشکەوتنیان، لە شارستانیان، لە هونەریان لە چ ڕووێکەوە؟!**

# ئیبن تەیمیە و سەلەفیەتی عروبەت

## بەشی چوارەم

## *جگە لە عەرەبی زمانەکانیتر خراپن نابێت هیچ عیبادەتێکی تری پێ بکرێت!

هەر لەو سیاقەوە ئیبن تەیمیە لە اقتضاء دا بە پشتگیریەوە ئەو قەولەی دامەزرێنەری سەلەفیەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەهێنێتەوە کاتێ پرسیاری لێدەکەن دروستە دوعاکردن بە فارسی؟! کوڕی حەنبەلیش پێی ناخۆش دەبێت، غافل هەتا لە قورئاندا کە چی گوتوە وچۆن ڕیزی لە زمانە جیاوازەکان گرتووە، کە زمانەکان بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی خوای داناوە، کەچی کوڕی حەنبەل دەربارەی زمانەکان، دەڵێت: " زمانێکی خراپە دروست نیە سوێندی پێ بخورێت و نوێژی پێ بکرێت و هیچ عیبادەتێکی تری پێ بکرێت! "وقد سُئل الإمام أحمد بن حنبل عن الدعاء في الصلاة بالفارسية؟ فكرهه. وقال: لسان سوء ولا يصح الحلف بها ولا الصلاة ولا سائر العبادات. ص ٢٠٤.

کەوابوو بە پێی ئەو ڕایە بیت کوردی و تورکی و پاشتۆیی و ئەمازیغی و ئەڵمانی و ئینگلیزیش گوناهە هیچ عیبادەتێکی پێ بکرێت، وەك بڵێیت خوا تەنها لە عەرەبی تێبگات! ئەگەر تەنها بیگوتبا نەخێر نوێژ نابێت بە فارسی، هەر تا ڕادەیەك جێگای قبوڵ دەبوو، بەڵام خەستری بکات و بڵێت سوێندی پێ بخورێت و نوێژی پێ بکرێت و هیچ عیبادەتێکی تری پێ بکرێت! ئەوە کرۆکی ڕەگەزپەرستی و عروبەتە، ئەخر پیرەمێرد وپیرەژنێکی چیاکانی کوردستان و فارس و بوخارا و تاجیکستان و ئەلبانیا و کۆسۆفۆ و هیندستان چۆن بە عەرەبی سوێند بخۆن و دوعا بکەن؟! ئەگەر ئەو شۆڤینیستی نەبێت، دەبێت شۆڤێنستی چی بێت؟!

# *ئەوەی عەرەبی پێ باشترین نەتەوە نەبێ مونافیقە وگەلچیە، شعوبیە!

لە [باب تفضيل جنس العجم على العرب نفاق] لە کتێبی "اقتضاء الصراط المستقيم" ئیبن تەیمیە دەڵێت:

" أبو محمد بن حرب بن إسماعيل بن خلف الكرماني قوتابی الإمام أحمد بن حنبل لە وەسفی سونەدا دەڵێت: ئەوەی من دەیڵێم مەزهەبی ئیمامەکانی عیلمە و خاوەن سونە و ئەسەرە لە ناسراوان لە ئەهلی سونە، کە ئێمە شوێنکەوتەی ئەوانین، هەروەها لە زانایانی عێراق وحیجاز و شام وجگە لەوانیش، ئەوەی لیی لادا یان تانەی لیدا یان عەیبداری کرد، ئەوە بیدعە چیە و پەڕاگەندەیە لە جەماعەت، و لادەرە لە ڕێگای ئەهلی سونەت و هەق، ئەوەش مەزهەبی أحمد وإسحاق بن إبراهيم وعبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور و غەیری ئەوانیشە، لەوانەی زانستمان لێیان وەرگرتوە کە دەیانگووت: "...حەق و پەسندی و پێشدەستی عەرەب دەبیت بزانین، و لەبەر حەدیسی پیغەمبەر خۆشمان بوێن کە دەڵیت: خۆشەویستی عەرەب ئیمانە، و ڕقیش لێیان نیفاقە [حب العرب إيمان، وبغضهم نفاق] ، -بە پێوەری خۆشیان حەدیسێکی زۆر زەعیفە! - بە قەولی شعوبیەکان ناڵێین، لە مەوالیە هەرچی وپەرچیەکان کە عەرەبیان خۆش ناوێت، و دان بە چاکترینی ئەوان دانانێن. خەڵکانێك دەڵێن عەرەب هیچ چاکتر نیە لە عەجەم، ئەوانە پێیان دەگوترێت گەلچیەکان [الشعوبية]... هەندێکیان هەن جۆرە خەڵکانێکی عەجەم بە چاکتر دادەنێن لە عەرەب، لە ڕاستیدا ئەو قسەیە تەنها لە جۆرێك لە نیفاقەوە سەرچاوە دەگرێت لە عەقیدە یان لە کردارێك زادەی هەوا وهەوەسی دەروونە تێکەڵ بە گومان و شوبهاتەکان."

